**پیاوەتی**...ئەگەر هەیە نەوەکانی حاجی کە خالی قەرزدارەکەیە، سەرجەمیان کور بن، چونکە ڕێژەی نێرینە بەسەر مێینە زاڵە لە کاتی پێتاندنی هێلکە و تۆ...!
**پیاوەتی**...ئەگەر کچێك لە خێزانێك بێت تەنها کچیان هەبێت و ماڵێکی سۆزداربن...!
**پیاوەتی**...لەوانیە ڕەفتاری و دلسۆزی ئەم بووکە، کە دەبێتە خیزانی یەکێك لە کورەکانی حاجی کە قەرزی لەلای کورە خوشکیەتی، دووبارە نەوەی کوری هەبێت بەهۆی سووری سورانەوەی ژینگەی ڕابردو لەناو خێزانێکی نوێدا...!
**پیاوەتی**...خودای گەورە دەفەرموویت (کچ، کور، کچ و کور، هیچ)....دەفەرمووێت (خودا بە ڕەحمە)....لەوانیە حاجی ڕیباخۆر لە ژێر هەرەشی تاقیکردنەوەی (خێزانی نێر) دابێت تاکو ئەمانەتەکەی لێوەردەگیرێتەوە...!
**پیاوەتی**...دەکرێت بڵێین ئەم قەرزدارە فێری مشەخۆری بووە بەهۆی خێزان و دۆست و برادەرانی، بەردەوام مێوان و شیوکردن و هاتوچۆی هەبووە...!
**پیاوەتی**...ئەم جۆرە دلسۆزی و ڕەفتارە بۆتە هۆی قۆستنەوەی گیرفانی، خالی، بۆئەوەی بەحەزی خۆی دەستی بۆببات و پارەی ڕابکێشت...!
**پیاوەتی**...لەوانەیە خێزانی، بەردەوام خەرجی زیادەی پێکردبێت بۆراگرتنی ماڵ و منال و میوان....!
**پیاوەتی**...وادەبینم جۆرێکی تر پیاواتی شاراوە لەم چیرۆکە دایە، ئەویش (گۆرینی ڕەفتار و دلسۆزی مرۆڤ) لەرێگای پیاوەتی و جولەی ڕۆژانە بۆ دروست بوونی متمانە و بردنی پارە و قەرز...!

لەکۆتای دووبارە دەڵێم (پیاوەتی) میوانەکان بووە، کە نانیان لەماڵی ئەم قەرزدارە خواردوە بوویتە هۆی شەرعەیت پێدانی متمانە و کەسایەتی نێو خێزان وەك (ریشی گەنج) ئەم دۆخەی بەرێوەبردوە، بۆیە میوان وەك مەر بە خواردن، فریویان خواردوە وە خالی ئەم قەرزدەرە بە پیاوەتی و کەسایەتی کورە خوشکی خۆی فریوی خواردوە، بۆیە کێشەی قەرز و ڕێبا و نەفرەتی داپیرە لە منالە جمەکەکە و نەبوونی (مەڕ)ی (مێ) لەم ماڵە، ئەم ئاژاوەیە دروستکردوە...

مامۆستا یەك شت ماوە بڵێم...
فەرموو بڵێ...
**پیاوەتی**...نەبوونی دەسەلاتی سالم و بەهێز، لەرووی یاسای و دادگەری و ئازادی نوێبوونەوەی سیستەم، ئەم جۆرە کۆمەلگایە بەرهەم دێت کە دەبێتە هۆی بێهۆی (دەرهاوێشتەی کلتوری دەرکی) لەناوەخۆی نەتەوەیەکی هەرێمیدا...!

مامۆستا...کۆتای بەم لۆژیکە بهێنین...

**پیاوەتی**...ئەگەر، لە هەبوون بگەرێوە نەبوون، ئەوکات لە هەلسانەوەی ژیانی ئاسای سنوورێك بۆ خەلك و خزم و دراوسێ دادەنێی، بەلام لە نەبوون بیەوە هەبوون و زەنگین بیت، کەسێکی برسی و نەدی و بدی دەبی، هەر پیاوەتی بکەی لەکۆتای گوی تێدەکەی...
**پیاوەتی**...جیهانی دیموکراسی و نیولیبرالی دژ بە کۆمەنیست، بەردەوام خەریکی پیاوەتینە، بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوە و خاك و دەسەلات و ئابووری ئازاد و ئایدۆلۆژیای نوێ و خۆشگوزەرانی بەکۆمەل لەسەر جیهانی هەژاری و سامانی ژێرزەوی....

**ئەم گفتوگۆیە هزریە، جۆرێکە لە شیکردنەوەی ڕۆتیناتی ژیانی ڕۆژانەمان لە چوارچێوەی بیرکردنەوەی فەلسەفی دوورە لە (سیاسەت)، ئێمەی گەنجی پیر، لە دوای ڕووخانی ڕژێم، وێلی ئازادی بیرکردنەوە و ئازادی سیاسی و ئازادی زانستی بووین، بۆیە بە ئەرکێکی ئەخلاقی دەزانم ئەو قوربانیە لەرێگای چەکداری بەخشیمان وەك خوێن، ئێستاش بۆمان هەیە، لە چوارچێوەی ئەم خوێنە بیربکەینەوە بنووسین و بلاوبکەینەوە، دەبیت ئەمەریکا و ناتۆ بە دلێکی گەورە ئەم چینە ڕۆشنبیرە لەناوەخۆی کوردستانی باشوور و شاری هەولێر بەهەند وەربگرێت و ڕێزی بگرێت نەوەك سەرکوتی بکات و لەناوی بەرێت...**

# رۆژی قیامەت...

بلۆگەر: جەودەت احمد
بابەت: بازنەی هزری
بەروار: 21ی نیسان 2024

جوان دانیشن، باسی چەمکی رۆژی داهاتوو دەکەین....
تونده ئەم بازنەیە دەبێت تەحەموولی هزری بکەن...!
ئەتوو....
چ، لە رۆژی قیامەت تێدەگەی...!
یالا لێرە دەست پێکەین.....!

**رۆژی قیامەت**...لەم سەردەم هەموو شتێك روو بدات دەبێتە کۆتای جیهان..!
**رۆژی قیامەت**...تێنەگەیشتن لە دەرهاوێشتەی کلتوری بیانییە...!
**رۆژی قیامەت**...کلتوری بیانی بەرێژەی هاوشانی کلتوری رەسەن دەجەنگێت..!
**رۆژی قیامەت**...گۆرینی دەولەت بۆ، مرۆڤ لەناو دەولەتە...!
**رۆژی قیامەت**...کۆمەلگای لاواز حەز بە کلتوری رەسەن دەکەن...!
**رۆژی قیامەت**...کوشتنی بەکۆمەل لە جیهان دەبێتە هۆی کاریگەری نەرێنی..!
**رۆژی قیامەت**...هێزی ئابووری کاپیتالیستی لەسەر گیرفانە، نەوەك دلسۆزی..!
**رۆژی قیامەت**...ولاتانی دواکەوتوو هەموو شتێك بە ناروونی دەبینن...!
**رۆژی قیامەت**...زانست پێش ئاین دەکەوێت، کاریگەری نەرێنی دەبێت...!
**رۆژی قیامەت**...ئاستی ولاتانی پیشەساز لە پێش هەژارە...!
**رۆژی قیامەت**...رەفتاری و دلسۆزی هەژار بەرامبەر جوانکاری سەردەمە..!
**رۆژی قیامەت**...کاپیتالیستی بەکاربەر، زالە بەسەر دلسۆزی هەژار...!
**رۆژی قیامەت**...قورئان و فەرمودە، هەموو شتێکیان کۆتای پێهێناوە...!
**رۆژی قیامەت**...دەرئەنجامی رۆحانی بۆ قوفلدانی ئاین، دووبارەدەکرێتەوە..!
**رۆژی قیامەت**...بەکاربەری ئاینی لە ئابووری جیهانگیری سووتاوە...!
**رۆژی قیامەت**...بیرکار لە رووی لۆژیك، ئاین دوادەخات بۆ سەلماندن...!
**رۆژی قیامەت**...هێزی سروشت دوور لە قورئان، پێناسەی خۆی دەکات...!
**رۆژی قیامەت**...کەواتە سروشت، هێزی شاراوەی هەیە پێشتر باسکراوە...!
**رۆژی قیامەت**...چەکی موگناتیس لەگەل هەورە بروسکە بەکاردێت..!
**رۆژی قیامەت**...شەپۆلی موگناتیسی و کوژانەوەی مرۆڤە لە 10 کاتژمێردا..!
**رۆژی قیامەت**...پێشهاتی کلتوری جەنگی سارده لە سەدەی تەکنەلۆژیا...!
**رۆژی قیامەت**...پێشهاتەکان بە رۆژی قیامەت وەسف دەکرێت لە سروشت..!
**رۆژی قیامەت**...قۆناغی پوچگەرای دەرهاوێشتەی کلتوری بیانییە لەناوەخۆدا..!
**رۆژی قیامەت**...هەموو شتێك تەمەنی کورت و خێرا دەگۆرێت و نامێنێت...!
**رۆژی قیامەت**...رووخانی حیزب بەرێگای دەنگ بۆ پەرلەمان و حکومەت...!
**رۆژی قیامەت**...بزوتنەوەی تاکەکەسی بۆ سەرۆك دەولەت و حکومەت...!
**رۆژی قیامەت**...کودەتای هەلباژاردنی ناوەخۆی جەماوەری حیزبی...!
**رۆژی قیامەت**...کودەتای هەلبژاردنی ئۆپۆزسیۆنی دژی کلاسیك...!
**رۆژی قیامەت**...هاتنی کۆمەلگای سێیەم لەریزی جیهانگیریدا...!
**رۆژی قیامەت**...جەنگی پرۆکسی و هەلخەلەتاندنی بەرامبەر بۆداگیرکاری...!
**رۆژی قیامەت**...داتەپینی ئابووری و ئاژاوەی گۆرینی سیاسی و حکومەت...!
**رۆژی قیامەت**...گۆرانی کەشوهەوا و بچووککردنەوەی قەباری زەوی...!

رۆژی **قیامەت**...پرۆژەی سەوزای و جەنگی ئەلکترۆنی و خۆبەخشی....!
رۆژی **قیامەت**...تاریککردنی تیشکی خۆر، بۆ ساردکرنەوەی زەوی...!
رۆژی **قیامەت**...داخستنی ئۆزۆن بەهۆی خۆلبارین دابەزاندنی گەرمی زەوی..!
رۆژی **قیامەت**...لەوانیە یاسای ئارەزوو ببێتە هۆی تێکدانی شیرازەی خێزان...!
رۆژی **قیامەت**...دۆلار دیبلۆماسی جێگای شەرەف دەگرێتەوە...!
رۆژی **قیامەت**...کەتنی کۆمەلایەتی و چاوبەستەی دۆلار و چارەسەر...!
رۆژی **قیامەت**...ئاستی کلتوری ماتریال دەگۆرێت دەبێت نوێکاری بەکاربەر..!
رۆژی **قیامەت**...ستوونی کلتوری دووەم لە حکومەت و رێکخراو کۆمپاندایە..!
رۆژی **قیامەت**...ستوونی سێیەم لە رۆحی رۆشنبیری ئالوگۆر دەکرێت...!
رۆژی **قیامەت**...ئەم ئالوگۆرە دەبێتە هۆشیاری بەکاربەری جیهانی ئابووری..!
رۆژی **قیامەت**...شەرعەیەتی مەرجەع هەلدەوەشێتەوە بۆ مەدەنیەت...!
رۆژی **قیامەت**...ئاستی بیرورای ئازادی تاك بەرتەسك دەبێتەوە...!
رۆژی **قیامەت**...لە ئەگەری چوارچێوەی چاودێری پۆلیسی دیجیتالی دابێت...!
رۆژی **قیامەت**...ئاستی بیرورای سیاسی دەبێتە لۆبی کۆمپانیای سێبەر...!
رۆژی **قیامەت**...زانستی فەلسەفە دەکوژێتەوە لەناو دەچێت..!
رۆژی **قیامەت**...پرۆژەی شەمەندەفەر 1لە5 پێچەوانەدەبێتەوە...!
رۆژی **قیامەت**...پرۆژەی تێسلا 3لە5 دیاریکراو دەبێت، لە قەباری مرۆڤ...!
رۆژی **قیامەت**...دەسەلاتی حیزبی دەبێتە شارەوانی و نوێنەری سێبەر...!
رۆژی **قیامەت**...دەولەتێکی خۆشگوزەران لەسێبەری زلهێزی بەکاربەر...!
رۆژی **قیامەت**...جیهانی پەرتووکی کاغەز دەبێتە کۆدی دیجیتالی...!
رۆژی **قیامەت**...ئاستی مەعریفی لەناو دەبرێت بۆبەکاربەری ئابووری...!
رۆژی **قیامەت**...زۆرترین نەخۆشەی لە جەستەی شاراوە ئەنجامی نابێت...!
رۆژی **قیامەت**...چەکی موگناتیسی و دەروونی، دەبێتە شەکەستی تاقیگە...!
رۆژی **قیامەت**...ئاستی مردنی کتوپر دەبێتە شۆکێکی داهاتووی جیهان...!
رۆژی **قیامەت**...دکتۆر و تاقیکە ناتوانن ئەنجامی کۆتای نەخۆش دیاری بکەن..!
رۆژی **قیامەت**...چەکی داهاتوو، جۆرێکە لە کۆنترۆلی زەوی قەباری مرۆڤ...!
رۆژی **قیامەت**...جەنگی سارد و ئالنگاری کلاسیك بۆ نوێکاری دیجیتالی...!
رۆژی **قیامەت**...زەوی خێرادەبێت لەگەشەکردن، سنووری نەتەوەی نامێنێت..!
رۆژی **قیامەت**...هێزی سروشت بەسەر دلسۆزی و رەفتاری مرۆڤ زالدەبێت...!
رۆژی **قیامەت**...هەموو روداوەکان بە(رۆژی دوای) لێکدەداتەوە...!
رۆژی **قیامەت**...بێ هێزی و پوکانەوەی عقلی، بەشێکە لەم تێگەیشتنانە....!
رۆژی **قیامەت**...ئاین دەبێتە پاردۆکس لە نێوان رۆح و بیرکاریدا...!
رۆژی **قیامەت**...پوجگەرای لای نووسەرانی گەمژە، بەشلەژان دیاریدەکرێت..!
رۆژی **قیامەت**...تێسلا لەشەقامی بازار دەخولێتەوە، بۆیاخچی نرخی 750دع..!
رۆژی **قیامەت**...راستە، بۆیاغی پێلاو نرخی 30 سەنتە و نرخی پێلاو 2000$..!
رۆژی **قیامەت**...دلسۆزی کلتوری بیانی زالدەبێت بەسەر هەژاری...!
رۆژی **قیامەت**...هەژار،هەژارتردەبێت بەهۆی جوانی و گەمژەی....!
رۆژی **قیامەت**...کەمی داهات و تێنەگەیشتن لە رێژەی کلتووری بیانی....!
رۆژی **قیامەت**...دلسۆزی و خۆشەویستی تێسلا دەبێتە کەمی داهاتی...!
رۆژی **قیامەت**...تێسلا دەبێتە داهاتی زۆرینە وە تێچووی کەمێنە لە شار...!
رۆژی **قیامەت**...
رۆژی **قیامەت**...
رۆژی **قیامەت**...ناوێرم باس بکەم... لێگەرێ...
رۆژی **قیامەت**...بۆچی....ئەوەی ئێمە، باسی هاتنی کلتوری بیانی یە....!

**ڕۆژی قیامەت**...ڕاستە بەلام عقل تەقەبول ناکات بەهۆی خێرای کات...!
**ڕۆژی قیامەت**...کەواتە لێبگەڕێن با (شوێن و کات و ڕووداو)دربخات....!
**ڕۆژی قیامەت**...ناخۆشە ئاینی ئیسلام ئاوای لێدێت....!
**ڕۆژی قیامەت**...لەوانیە ببێتە بەکاربەری کەسی دوور لە یاسای و کارگێری...!
**ڕۆژی قیامەت**...ڕاست دەکات، چونکە کلتور هەموو شتێك دەگۆرێت....!
**ڕۆژی قیامەت**...جەنگی جیهانی سێیەم جەنگی دیجیتالیە و کاغەزنامێنێت...!
**ڕۆژی قیامەت**...جەنگی جیهانی چوارەم، مرۆڤ کۆنترۆل دەکرێت....!
**ڕۆژی قیامەت**...وا دەبینم جەنگی کەمکردنەوەی مرۆڤە و کوێرەوەرییە...!
**ڕۆژی قیامەت**...جەنگی ئەتۆمی و خەندق و چەقبەستووی کۆتای هاتووە...!
**ڕۆژی قیامەت**...جەنگی ئەتۆمی کوژاندنەوەی مۆلیدە و گازە و بەنزینە...!
**ڕۆژی قیامەت**...جەنگی چەکی ناوەکی پاکە لە هەموو جیهان....!
**ڕۆژی قیامەت**...جەنگی (کەرگانە) حەزت لە چ، بوو؟ دەیکات...!
**ڕۆژی قیامەت**...مرۆڤ دەبێتە کۆیلەی مۆبایل و تۆری کۆمەلایەتی....!
**ڕۆژی قیامەت**...پارە و هەلی کار نامێنێت لە کاش دەبێتە کۆد....!
**ڕۆژی قیامەت**...برسیەتی و جەنگ لەرێگای زیرەکی دەستکرد بەرێوەدەچێت..!
**ڕۆژی قیامەت**...ژینگەو دێهات و شار و گۆرستان، زەوی لوشی دەکات...!
**ڕۆژی قیامەت**...ئاسن لەجۆری نانۆ بەرهەمدێت، ووشکە و تەرنابێت...!
**ڕۆژی قیامەت**...ئەمم، لە خانەی بالی پەپوولە وەرگێراوە و سەرئاو دەکەوێت..!
**ڕۆژی قیامەت**...کۆتای بە بورکان و خۆر دەهێندەرێت.....!
**ڕۆژی قیامەت**...

باکۆتای پێ بینین ئەوەی باسمانکرد سەرجەمیان دەرهاویشتەی کلتوری بیانی یە لەسەر کلتوری رەسەن لەناوەخۆی جیهاندا....!

وابزانم هیچ شتێك ناگەرێتەوە پاش، دەبێت هەموو کەس، بەکاربەری ئەنتەرنێت و لەژێر چاودێری زیرەکی دەستکرد و شۆرەشی مندالی تاقیگە بەرێوەبچێت....

ئەوەی من دەبینم، جیهانی ڕۆژهەلاتی ناوەراست دەبێتە بەکاربەری ئەم بازارە ئابوورە....

وابزانم، چێل و مەر و مریشك نامێنێت، دەبێتە خۆراکی دەستکرد...!

بەسە، توخوا بەسە، جەوتانگرتم.....
دەبرۆ (صە)گێ، ئەوە لێلێیە هێشتا لۆلۆ مایە....

**ئەم گفتوگۆیە هزریە، جۆرێکە لە شیکردنەوەی ڕۆتیناتی ژیانی ڕۆژانەمان لە چوارچێوەی بیرکردنەوەی فەلسەفی دوورە لە (سیاسەت)، ئێمەی گەنجی پیر، لە دوای ڕووخانی ڕژێم، وێلی ئازادی بیرکردنەوە و ئازادی سیاسی و ئازادی زانستی بووین، بۆیە بە ئەرکێکی ئەخلاقی دەزانم ئەو قوربانیە لەرێگای چەکداری بەخشیمان وەك خوێن، ئێستاش بۆمان هەیە، لە چوارچێوەی ئەم خوێنە بیربکەینەوە بنووسین و بلاوبکەینەوە، دەبیت ئەمەریکا و ناتۆ بە دلێکی گەورە ئەم چینە ڕۆشنبیرە لەناوەخۆی کوردستانی باشوور و شاری هەولێر بەهەند وەربگرێت و ڕێزی بگرێت نەوەك سەرکوتی بکات و لەناوی بەرێت...**

# پراگمات...

بلۆگەر: جەودەت احمد

بابەت: بازنەی فەلسەفەی

بەروار: 6ی جوون 2024

پراگمات...

دەی، دەی، دەی....

جوان، خۆتان ڕێكبخەن و بە مورتاحی دانیشە، عەشائیری، كوی مورتاحی، دانیشە، حەزدەكەن سەراوبن دانیشن. گرینگ ئەوەیە گفتوگۆ بكەین...

یالا، بزانم چ لە چەمكی پراگمات، تێدەگەن..؟

**پراگمات**...

**پراگمات**...گەوجاندنی عەوام بەناوی ئاین لە بەرژەوەندی كۆكردنەوەی زەكات و خێر بۆ كۆشك و ژن و گەشت و خۆشی ژیان...!

**پراگمات**...گوكەرێكی گەورەیە، بەناوی نەتەوەی، چینی پرۆلیتاریا، كەردەكات بۆ بەدەستهێنانی دەسەلات و شەرعیەتدان...!

**پراگمات**...دكتۆرێكە لەدژی حكومەت و هاوپیشەی خۆی، بەكەمترین نرخ كاردەكات و خەلك فێری مشەخۆری بێ نرخی دەكات...!

**پراگمات**...بازرگانێكی درۆزنە، خەلك فێری هەرزانی و بێ كوالێتی پێداویستی رۆژانە دەكات....!

**پراگمات**...كەسێكی هونەرییە، بەناوی گەمژەی كلتوری بیانی جۆرێك لە ئاوەسبوونی هونەری كلتوری رەسەن بەرهەم دەهێنێت...!

**پراگمات**...دەولەمەندێكی (فەعۆیە) لەترسی حیزب، دیوەخان و ئالا و وێنەی حیزبێك دەخاتە سەر سەری بۆئەوەی لە ژیان بمێنێتەوە...!

**پراگمات**...چەكدارێكە زیاتر لە دە جۆری پیشە، كاردەكات، بۆ بەدەستهێنانی پارە، وەك سەوزەفرۆش، شیرفرۆش، زەویفرۆش، چەكداری، مەعرەزچی، وەستای دیواری، وەستای ئاوەرۆ، وەستای كارەبا، كارمەندی كۆمپانیا، هی تر.

**پراگمات**...دوگمەی F2ە بۆ هێوركردنەوەی جەماوەری حزبی بەناوی خەبات..!

**پراگمات**...شیرە شیری میدیاییە بۆ گەوجاندی بینەر بەناوی دژە سیاسی..!

**پراگمات**...خەسوو، بەدوای دەهۆلكوتنی گیروگرفتی بووكە لە كۆلاندا...!

**پراگمات**...حاجیەكی كلاوچیە پارەی بە ڕیبا دەدات بەخەلك...!

**پراگمات**...فرۆكەی بێفرۆكەوان بە حەزی خۆی لە ئاسمان دەخولێتەوە...!

**پراگمات**...چەككردنی عقلە، بەرامبەر بە دۆلار و زێر بۆ بەكاربەر...!

**پراگمات**...دەولەمەندێكە وەك منال حەز بەیاری دەروونی خۆی دەكات...!

**پراگمات**...جوتیارێکە، دوو صەگە، گاصن و تراکتۆری هەیە...!

**پراگمات**...سوپایەکەی حیزبی کۆیلەیە دەلێت من هاوپەیمانم...!

**پراگمات**...بەنێر لەدایکبووە دەلێن میزاجیە و مێیە...!

**پراگمات**...تەنها نێر، مێ، نێرومێ، هیچ...!

**پراگمات**...نێرەمووکە دەلێن کاری خودایە...؟

**پراگمات**...نێرمووکە هۆکاری مرۆڤ و دەوروبەرە، پەیوەندی بەخودا نیە..!

**پراگمات**...خودا بریاری خۆی داوە، کێ منالی نێر ومێ هەبێت نەوەك نێرەمووك.

**پراگمات**...شوفێری تەکسیە بە (قەحپەخانەی گەرۆك) وەسف دەکرێت...

**پراگمات**...ژنە بازرگانە، مێردی لەدەرەوەی وەلاتە و ئەدمینی گەرۆکی هەیە...!

**پراگمات**...دەرگای مووبەریدە کلۆری زۆرگرتووە...!

**پراگمات**...نەخۆشی گورچیلە زۆربووە...!

**پراگمات**...ژن، بێقونەبانە هەموو رۆژ، ژەمەکانی برنجە....

**پراگمات**...جەستەی نەخۆشە، قومار بە پارەی میللەت دەکات...!

**پراگمات**...ئۆتۆمبێلی V8 لە شەقام و تاسە و کۆلان، تەرەتانێ دەکات...!

**پراگمات**...خۆهەلواسینە بەجیهانی دیجیتالی بەناوی نوێبوونەوەی هزر...

**پراگمات**...بالای کورتە، بە دەرزی بالای بەرزدەبێت...

**پراگمات**...کۆمەلگایەکە، مرۆڤ تێدا بەفیرۆدراوە....!

**پراگمات**...پشت بەهاوردە و گەوجاندنی ئابووری ناوەخۆی دەبەستێت...!

**پراگمات**...وێنەگرتن لە پێش سلوکی سیاسی و سیاسەتە....!

**پراگمات**...خۆبادان لە جلی کوردی و عەینەکی رەش، پێی دەلێن کاریزما...!

**پراگمات**...وەك پێلاو پۆلش کراوە سەرو ریشی و سمێلی، دەلێت تەرپیرم..!

**پراگمات**...ماکەرپاچە (بێ سمێلە)، کاکە ئەمن گەنجم، کەچی تاوانی زۆرە...!

**پراگمات**...لەژنی بێزارە، راستەوخۆ لەکارکردن بۆ مالی دووەم رادەکات....!

**پراگمات**...نووسەرێکی گەمژەیە وەك حەلاق پەرتووکەکانی هەلواسیوە...!

**پراگمات**...دەست و پێی، تێك ئالاوە لە نووسین و بلاوکردنەوە...!

**پراگمات**...ولاتێکی پیشەسازە، رۆحی لە هزر چووە...!

**پراگمات**...گشتاندنی تیرۆر بۆ مانەوەی هێزی خۆی لە جیهان...!

**پراگمات**...نرخی دۆلار بەگوێرەی جەنگی پرۆکسی و ئاژاوەی سیاسییە..!

**پراگمات**...نرخی زێر، بەگوێری سوتاندنی دوکانی زێرینگرە...!

**پراگمات**...مێشك باغەیە، راوێژكاری نیشتیمانی یە...!

**پراگماتە**...مەتری زەوی بە 2000 دۆلارە، شارێكە هیچی تێدا نیە..!

**پراگمات**...لەترسی قەرز، فیشەكەی بەخۆی وەناوە....!

**پراگمات**...دزێكی دوو سەرە، سەرێكی بۆ حیزب و سەركی بۆخۆیەتی..!

**پراگمات**...كەتنكەرەو دەلێن شێخە، عەیبی نی یە، چونكە پارەدارە...!

**پراگمات**...شوی ناكات خۆی بەبێوەژن ناونوسكردوە...!

**پراگمات**...نەخۆشی مایەسیری هەیە، لەگەل ترِی خۆی بەشەرِدێت..!

**پراگمات**...هەینی بەدل نەبوو، لەناو هەینی مزگەوت دەگۆرێت...!

**پراگمات**...منالەكان لەترسی خالۆژنی سەردانی مالی باپیریان ناكەن...!

**پراگمات**...مدیرە، وەك صەی هار، تەمەنی 40 رۆژە لە پۆستی كارگێری...!

**پراگمات**...بانگ بووە ئەلكترۆنی بۆ دلی مانەوەی حیزب لە دەسەلات...!

**پراگمات**...كەر بترِی، زیانی بۆ حیزب هەبێت، قونی كەر، چەور دەكەن...!

**پراگمات**...مەلا دەسكەلایە، بە حەزی خۆیان، یاری بە میمبەر دەكان....!

**پراگمات**...وەك ئەسپ رِامكراوە بەناوی نووسەر (تەس)ی دەكەن...!

**پراگمات**...گویَ لە نوخبەی ئازاد دەگرێت بۆمانەوەی خۆی بەلام دژیەتی...!

**پراگمات**...ئەگەر توورە بوو، فیشك بە ئاسمان وەدەنێ وەك چەتەی دەریا..!

**پراگمات**...زمان لالە و نەزانە، بەسواربوونی ئەسپ شەهامەتی دەردەخات..!

**پراگمات**...حەزیان بە رەنگاو رەنگە بۆ مانەوە لە جیهانی زیرەكی دەستكرد..!

**پراگمات**...سێ رۆژان، ناو بازار كۆنترۆل دەكات بۆ وێنەگرتنی سێلفی...!

**پراگمات**...كەوتنەخوارەوەی كۆپتەر، نیشانەی هاتنی ئافتە بۆ ناوەخۆ...!

**پراگمات**...عینادی حیزب و سیاسی ناویان لە لیستی (مانگرتنی سەربرخانە)یە..!

**پراگمات**...ترمپ تیرۆر دەكرێت دەبێتە ئایكۆنی ئەمەریكا وەك جۆن كەنەدی..!

**پراگمات**...لەناوبردنی ترِمب هێشتنەوەی دەولەتی قوولە لە ئەمەریكا...!

**پراگمات**...نیشانەی لەناوچوونی ترمپ دیارە، ناوی لە لیستی عینادەكانە...!

**پراگمات**...سەروەری ئەمەریكا لە دەسەلاتی قول جێگیرە....!

**پراگمات**...قەزافی و صدام و ئەوانەی تر كەماوەن، هەمان چارەنووسە..!

**پراگمات**...پۆتین ناوی لە لیستە، بۆ نوێبوونەوەی دەسەلاتی ئاسیا...!

**پراگمات**...هەست دەكەم بابەتەكە ترسناكە...!

**پراگمات**...هیچ نیە، ئەمەریكا هی خۆمانە، لەگەلی برۆ، هاوكاریت دەكات...!

**پراگمات**...نیشانەی کەوتنی دەسەلاتی عێراق نزیکە بۆ 2060...!

**پراگمات**...هەرێمی باشوور دەبێتە ئۆپۆزسیۆن، دواتر بۆ ئازادی سیاسی تاك...!

**پراگمات**...ئەمەریکام خۆشدەوێت، پیاوی سیاسی و پیشەسازی تێدایە....!

**پراگمات**...دۆلار، دەبێتە جەنگی ئاژاوەی لەناوەراستی 2025 بۆ سەرەوە...!

**پراگمات**...برێکس سەری ج7 دەخوات بەهۆی کەوتنی دۆلار....!

**پراگمات**...کۆریای باکوور تۆپانێ بەباشوور دەکات....!

**پراگمات**...ئەمەریکا، ژانە قونی کوریای باکوور لە جەستەیماوە...!

**پراگمات**...مەزهەبی لینین پارادۆکسی چەوساندنەوەی ئاژاوەی ئاسیایە...!

**پراگمات**...ئەمەریکا فێرە قوونە، هەرکات وەزعی شووربوو دەڵێت بدەبەرێ..!

**پراگمات**...وەك قەسابە لەکاتی گۆشتفرۆشت پشت لەکریار دەکات...1

**پراگمات**...گۆشتی ئێسك لەگەڵ نەرمك، دەرخواردی کریار دەدات...!

**پراگمات**...ئاوێنەی ناو دوکانی قەصاب بۆ چاودێری کریارە....!

**پراگمات**...کەواتە ناتۆ چاودێری دەستی چەپی ئەمەریکایە بۆ ئەم شەرە...!

**پراگمات**...زیرەکی دەستکرد دەبێتە نێرکەر لە جیهان....!

**پراگمات**...جەمەعاتی رەنگاورەنگ خشەی دێت لەکۆمەڵگا....!

**پراگمات**...کۆریای باشوور زیانی بەرکەوت لە فرۆشتنی براندی ئەلکترۆنی...1

**پراگمات**...تایوان کۆچی کرد بۆ تیکساز...!

**پراگمات**...پیاونیە خۆی بابدات لە رۆژهەلاتی ناوەراست...!

**پراگمات**...بەدرۆن و ئۆتۆمبێل، کەوتنە دوام...!

**پراگمات**...هیچ نیە لێرادێی... ئەمەریکات خۆشبوێ...!

**پراگمات**...چاومانە ئەمەریکا...!

**پراگمات**...ترمپە سورە دەڵێت ناتۆ نامێنێت....!

**پراگمات**...لۆیە ناوی لە قەصابخانەی دادوەری کەیسی لەشفرۆشانە...!

**پراگمات**...هەلبژاردن دەکرێت، بۆ لاوازکردنی حزبی کلاسیك و خێزانی...!

**پراگمات**...کۆفتەرەکەی رەئیسی نیشانەی پەیام بوو بۆ هەرێمی باشوور...!

**پراگمات**...ئەمەریکام زۆرخۆشدەوێت...دەمەوێت برۆمە وێندەر...!

**پراگمات**...دانیشە خۆشەویستی تۆ، ترسی کوشتن بوو لە سەرنووسین..!

**پراگمات**...تەمەنت بەسەرچوو، بۆ هەلی کار...!

**پراگمات**...دەبێتە جوندی (سەرباز)ی دیجیتالی...!

**پراگمات...**دەنگی گەمژەی هەمان دەنگی زانستییە...!

**پراگمات...**شۆردنەوەی ئاین و نەتەوە و گیرفان و خاکە....!

**پراگمات....**

**پراگمات....**

**پراگمات...**ئاماری عێراق و کوردستانە...

**پراگمات...**بۆکۆنترۆلکردنی خەلك و دەسەلاتە بەرێگای دیجیتالی...!

**پراگمات...**دەبێتە بایۆمەتری لە زیندانی دیجیتالی، پیاو نیە خۆی بابدات....!

**پراگمات...**گورگ و مەڕ، بەیەکەوە ئاو دەخۆنەوە...!

**پراگمات...**عێراق کەونە (چەڵەی) سۆڤیەتە، بۆیە کلك و باری دەکرێت...!

**پراگمات...**عێراق و هەرێم بەمادەی 1483 لەئازادکردن بۆ داگیرکاری...!

**پراگمات...**کەس کارت پێنادات...!

**پراگمات...**وەکی (ئیدۆ)ی، دوو صەگە بزن و مەڕی بەخێو دەکەین...!

بوەستە، بوەستە....

هەرشتێك ئامانجی خێراو دیاریکراوبوو، دەبێتە پراگمات....

بوەستە، بوەستە....

هەرشتێك ئامانجی خێراو دیاریکراوبوو، دەبێتە پراگمات....

**لەکۆتای شتێکی سەیر دەلێم لە یاسای پراگمات...دەبێتە پراگماتیست...**

**پراگماتیست...دواتر خودگۆی لە بازنەی کراوە باس دەکەین...**

**لەکۆتاییەکانی سەدەی 20 سالی 1990 و کۆتای جەنگی سارد، جیهانی (ئەپۆکلێپس) واتە (خودای سەرزەوی)، یاسایەکیان هەیە بەناوی (قوربانی سەربڕ)، ئەم یاسایە بۆ نوێبوونەوەی زەوی و سیستەمی سیاسی جیهان لە کلاسیك بۆ پۆستمۆدێرن، واتە هەر کەسێك، باش گوێبگرن، هەرکەسێك لە چینی (مەدەنی، سیاسی، بازرگانی، سەربازی، رۆژنامەوانی، نووسەر) عینادبێت و کێشەی دروست بکات لەکۆتای سەرجەم بەلگەکان کۆدەکرێتەوە دەیخەنە ناو پرۆژەی مانگرتنی سەربڕین، واتە دوور لە خێزان و جەماوەر و ئاوەدانی، لەناویدەبەن و ئاسەواری نامێنێت.بۆیە گۆڕانی دەسەلاتی جیهان، لە کۆتای جەنگی سارد و سەرەتای و ناوەراستی جەنگی ئەلکترۆنی، بەم یاسایە پەیرەوی دەکرێت سیاسەت و سیاسی نوێدەکرێتەوە..**

**ببورە، ئەمەریکا، ئەمە لۆژیکی یاسای فەلسەفی پراگمات بوو وەك گفتوگۆی بازنەی خودگۆ ئەنجامم دا...**

# کات...

بلۆگەر : جەودەت احمد
بابەت : بازنەی هزری
بەروار : 19ی جوون 2024

ئەمرۆکە باس لە کات دەکەین، جوان دانیشین بابزانین چەمکی **کات** چی یە؟
بالێرە دەست پێبکەم...بیرکردنەوەیەکی پەتی بێت...
ئەتۆ، چ لەبارەی **کات** دەزانی...

**کات** : شەورۆژ دەوران دەکات، کات بەرهەم دەهێنێت..!
**کات** : لە شوێن، بەرهەمدێت واتە تەواوکەری شوێنە، کات..!
**کات** : کەواتە دەبێت ئەم شوێنە رووداوێکی تێدابێت بۆ دروست بوونی کات..!
**کات** : دایکم هەموو جار دەیگوت ژیان وەك قالبە چوارگۆشەیەکی چووکلێت وایە ژیان تێدا بەردەوامە..!
**کات** : قالبە چوکلێتەکە شوێنێکە کە رووداوەکانی ژیان تێدا روودەدات لەم کاتە دەبێتە کات..!
**کات** : ئەگەر قالبە چوکلێتەکە بەتالبوو ؟ ئەوکات رووداوەکە دەبێتە نادیار لە کاتێکی ئێستا لەناو رابردوودا..!
**کات** : بەرکەوتنی هەستەکان نابێتە هۆی کات چونکە ئامرازێکی پالنەری خۆرێبەری و ئاراستە کراوبووە..!
**کات** : ڕاست دەکات، هۆکارەکەی زمان و خاك و ئاینە دەبێتە هۆی بەرکەوتەی شوێن کە کات تۆماردەکات..!
**کات** : ئەگەر ئەم کاتە پارادۆکس بوو، لە رابردوو بەناوی نەتەوە تۆمارکراوە و لە ئێستا پارادۆکسە بوونی نیە...!
**کات** : ئەگەر هەیە ئەم جۆرە کات دەچێتە ئاماژەی (عاشا) واتە کات لە رابردوو ئامرازێك بووە بۆ گەیشتن بە ئێستا..!
**کات** : وابزانم ئامانج بووە دواتر لە ئامرزێك بەرهەمهاتووە لە چوارچێوەی شوێن و رووداو، کاتێکی بەتالە..!
**کات** : ئەگەر پێشبین بکەین بۆ سەدەی 22 و ئەم کاتە بەتالدەبێت، بەئەگەری هەمان فێل لەکات کردن بۆ کوردستانی باشوور..!
**کات** : ڕاست دەکات دەبێتە ئامانج لە شوێن و رووداوەکان دووبارە کات بۆ هەمان ئامراز و ئامانج بۆ سەدەی 20 دەگەرێتەوە..!
**کات** : کەواتە کێشەی کورد لە ئەزەلەوە کات و شوێنی هەبووە بەلام بەهۆی ناهۆشیاری خێزانی کورد ئەم کاتە بوویتە ئامرازی کوردبوون...!
**کات** : ئاوا، وێنەی بۆ دەکەم کە ئامانجێك لە پشت ئەم کاتە هەبوو بۆ ئەوەی ستوونی پەرینەوەیەکە بۆ رۆژهەلاتی ناوەراست کەکوردبوون بووە..!
**کات** : هەمان ستوونە لە سەدەی 22 ئەم کاتە دەگەرێتەوە کە قەبارەیەکی بۆ کورد دیاری دەکات بەناوی کوردستانی گەورەی لامەرکەزی...!
**کات** : سورانەوەی کات بە دەوەری بەردە رەشەکە واتە سوورانەوەی روحە بەدوای خالی صفر لە بازنەیەکی داخراو کە دامەزراوە..!
**کات** : دەورانی فیزیکی کەعبە واتە مانەوەی قەبارەی موسلمانان لە مێژووی رابردوو لە سەر داهاتووی بەردەوام بێ گەرانەوە بۆ رووداوەکان...!
**کات** : لێرە، کات یاسایە بۆمانەوەی ئاین و ستوونی ئاینی ئیسلام لە سەرزەوی وە جۆرێکە لە شوێن و کات بۆ نووێبونەوەی رۆح..!
**کات** : کێشەی کورد هەمان خالی سورانەوەی کەعبەیە بەلام یاسا و رێسای نیە بۆیە لە خالی بەتال دەخولێتەوە لەم کاتەدا...!
**کات** : هۆکاری ئەم کاتە لە کێشەی کورد وەك ناوکی ئەتۆمی وایە بەردەوام لە شوێنی خۆی هەلبەزودابەزدەکات لە کات و شوێنی خۆیدا..!
**کات** : کاتی و شوێنی کورد دەبێتە هۆکاری بێ ئەنجام چونکە بە لاوازی لە کاتی و شوێنێکی تر ئاراستەی دەکرێت بۆمانەوەی خۆیان لە کێشەی کوردا..!
**کات** : لێرە نابێتە ڕەسن بۆ بەرهەم هێنانی عقلی بەلکو بابەتی و بەرکەوتنی هەستەکانە لە هەرێمی کوردستانی باشووور و گەورە..!
**کات** : دوو هۆکار هەیە کە کورد لە سەدەی 22 دادەمەزرێت، شوێن و کاتە بۆ گۆرینی رۆژهەلاتی ناوەراست لە پێگەی دامەزراوەی نەتەوەی...!

**كات** : دووباره ئەم كاتە پارادۆكسە بۆ هەمان سیناریۆی ئەم قالبە چووكلێتە وایە كە هیچ بەرهەمێكی هرزی و عقلی پەتی لەخۆی وەنەگرتووە بەڵكو هاوردەیە..!

**كات** : پرسیارەك، ئەگەر من لە شاخ فیشەكێكم تەقاند لە سەدەی 20 وە لە 21 ئەم فیشەكە بووە دۆلار بەهۆكاری ئەو كاتەی كە پارتیزان بوویمە، كاتی داهاتوو چی یە..!؟

**كات** : وادەبینم هەمان فیشەكە لە جەستەی كاتێكی دیبلۆماسی ئۆپۆزسیۆن بێ ئەوەی ئەم شوێنە و كاتە عقلی پەتی كوردی تێدابێت واتە بەتاڵە...!

**كات** : ئەم فیشەكە بگەڕێنەوە ناو لوولەی كلاشنیكۆف، قەڵەمێك دابنێ كە قەبارە و مەودای نزمە بەڵام دەتوانێت هێزێكی رۆحی هەبێت بۆ وەرگرتنی كات و شوێن لە سەدەی 20، چ روودەدات..!؟

**كات** : لێرە قەڵەم بەسەر هێزی جەستە و دۆلار زاڵدەبێت بەڵام مەودای خەباتی پارتیزانی درێژدەبێتەوە بۆ 100 ساڵ تاكو جێگیردەبیت بێ ئەوەی زیانی گیانی و شوێنی هەبێت...!

**كات** : هەست دەكەم ئەم فیشەك و قەڵەمە راوێژكاری بیانی تێدابووە بۆیە نەیتوانیوە كورد خۆی لەم سەردەمە جێگیربكات لە پێگەی كات و شوێن و رووداوەكات واتە یاری پێكراوە بەرێگای شاراوە...!

**كات** : ئێستا فیشەكەكە تەواو رابكێشە بۆناو مەغزەنی كلاشینكۆفەكە و قفلی بدە و تفەنگەكە فرێبدە لایەك، ئایا ئەم كاتە بەرجەستەیە یان هاوردەیە بۆ ئەنجامدانی ئەم كردارە بۆ ئەم بابەتە كە كورد بوونی هەیە لە دەرەوەی خۆی..!

**كات** : كاتی وەرگرتنی ئەم تفەنگە هۆكاری شاراوەی نێوان كات و شوێنی كوردستان بووە كە نەتوانراوە لە عقلەوە جۆرێك لە كوردبوون خۆی دەربخات دوور لە نمایشی كێشە و جوانی جوگرافی...!

**كات** : هۆكاری جوانی و كێشەكان بووە كە كورد لە كاتی خۆی نەیتوانیوە رۆڵ بگێرێت بەڵكو ساویلكەی خێزانی كوردە بەهۆی باوەری رۆحی و جوتیاری و كرێكای و هەژاری لە ناوە رووداوەكانی خۆی بوویتە قوربانی جوگرافیاكەی...!

**كات** : ئەم قالبەی چووكلێت كە بەتاڵە یان پڕە هۆكاری كات و شوێن و رووداوەكەیە كە دەرئەنجامی ژیان نمایش دەكات لە شێوەی كوردبوون و كوردستانی باشوور و گەورە...!

**كات** : وێنەی بكە ئەم قالبە چووكلێتە وەك كەعبە ئەمانەت بێت لەلای خێزانی كورد، دەكرێت گەشە بكات یان وەك چەقبەستووی دەمێنێتەوە ئەگەر وەبەرهێنانی عقلی ناوەخۆی لەناو نەكرێت...!

**كات** : لە سەدەی 22 كوردستانی باشوور لە شێوەی قالبە چووكلێتێكی بەتاڵە چونكە هەمان پاڵنەری رابردوو لە كات و شوێن لەسەر كوردبوون دەمێنێتە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی كوردی لە سێبەری ئیمپراتۆریەتی نادیار..!

**كات** : كەواتە روون ئیمپراتۆریەتی نادیار لە كات و شێونی سەدەی 20 وەك پێشهاتێك رۆڵی هەبوو بۆ مانەوەی كورد لەم ناوچە بەڵام رۆڵی كورد ئاراستەكراوە لە پێگەی ئیمپریالیزم نەوەك ئیمپراتۆریەتی نادیار..!

**كات** : بەگوێری بەڵگە مێژووی هەولێرێم ئاوابینەوە ئاوا بیستووە دەڵێت ئەمانە هاوردەی ئاشووریەكانن بۆ ئەم سنوورە بۆیە بەشێكن لە كات و شوێنی كێشەی كورد لە رابردوو بۆ داهاتووی بەردەوام...!

**كات** : ئەگەر هەیە میراتی پێكهاتەكان هەمان كێشەی كات و شوێنی نەتەوەیان هەیە كە هۆكاری راگواستن و پەرتەوازەی سەردەمەی ئیمپراتۆریەتی ئاشوور و كلدانیەكان بوینەتەوە..!

**كات** : مێژوو وەك ئەم قۆدیە چووكلێتە وایە خۆی دووبارە دەكاتەوە بەهۆكاری پاڵنەری دەرهاوێشتەی دەرەكی و هەڵەی ناوەخۆی پێكهاتەكان لەم سنوورە لە هاوشانی خاكی كوردستان و كوردبوون...!

**كات** : كەواتە جەژنی نەورۆز هەمان چارەنووسی دەرهاوێشتەی هاتنی ئیسلامە كە كلتور لەناو دەبات دەیخاتە قالبی قالبە چووكلێتێكی بەتاڵ بۆیە داخزانی رێژەی دەبێتە هەمیشە لە پێگەی ئاین بەسەر نەتەوەدا...!

**كات** : نەخێر، نەوۆز لە ئەزەلەوە واتە توانەوەی بەفر و كردنەوەی رێگای دێهات و هاتنی سەرەتای بەهار بۆیە ئەم ئاگرە بەهۆی هەڵەی ناسیۆنالیزمی كورد و دەرچوون بۆ سەیران و جۆرێكە لە نەخێرە لە ئایندا...!

**كات** : لەوانەیە، چونكە ئەم ناسیۆنالیزمە بۆ پیشاندانی دەرەكی و نوێبوونەوەی ناوەخۆ، هۆكارێكە بۆ توورەبوونی چینی (رۆحانی) كە خۆیان بەشوێنگرەوەی ئاین دەزانن بۆیە لەكەداری دەكەن...!

**كات** : راوەستن، كات و شوێن و رووداوەكە جۆرێكە لە ناهۆشیاری خێزانی كوردە بۆیە ئاینەكان و كوردبوون كە بۆ دوو مەرج وەك مانەوەی كورد لە نەورۆز وە مانەوەی ئاینە دژی نەورۆز، ئەم (كات)ە لەم شوێنە خۆی نوێدەكاتەوە...!

**كات** : بابەتی و ڕهای هەمان بەركەوتەی كێشەی كوردە لە (كات و شوێن و هێز و رووداوە)كان. ناتوانێت عقلێكی پەتی هەبێت كە بەخاوی كوردبوون لە دایكببێت بەڵكو جۆرێكە لە (دلسۆزی كۆیلەبووون) لە سێبەری ئیمپریالیزم دەمێنێتەوە.

**كات** : بەهۆكاری ئەوەی بابەتییە کە بەردەوام لەبۆشای نەبوونی خۆی، کوردبوون دەخولێتەوە بەردەوام بابەتیانە لە جیهان دەخرێتە بەرباس بەگوێرەی بەرژەوەندی کات و شوێن لەناوەخۆی کوردستانی گەورەو باشووردایە...
**كات** : ڕەهایە، قۆناغی ناسیۆنالیم و ئنتەرناسۆنالیزم بە کوردبون لە زمان و خاك و مێژوو دەخولێتەوە بەلام ناتوانێت لە کات و شوێن گۆرانکاری بکات بەسەر باشوور و کوردستانی گەورە چونکە لە کۆنەپەرەستی و نەتەوایەتی دەخولێتەوە.
**كات** : وابزان کورد هەرناتوانێت خۆی رزگاربکات لە داگیرکاری لە کات و شوێنی رابردوو لە داهاتووی بەردەوام لە چوارچێوەی بەکاربەری ئابووری و بازاری جیهانی چونکە هەمان هەستی بەکاربەر و خۆرادەستی هاوردە دەکات بۆمانەوەی خۆی.
**كات** : قەبارەی ناهۆشیاری کورد لە نازانستی دەبێتە زانیاری بەرکەوتە لێرە دەبێتە ناهۆشیار و مەترسی بەسەر جەستە و خاك و زمان و مێژووی چونکە زانستی نیە بەڵکو بابەتی و بەرکەوتەی ڕووداوەکانە، دوورە لە دامەزراوەی پەتی..
**كات** : حەزێکی سەرەتای زانیاریان هەیە نەوەك زانستی ئەمە نابێتە هۆکاری بیرکردنەوەی پەتی لە کات و شوێن بەڵکو کوردبوون جۆرێکە (لەزۆڕەوی بێ ناسنامە). ناوی هەیە ناوەرۆکی نی یە.
**كات** : قۆدیە چووکلێتێکە کە ژیان تێدا هەمەرەنگە لە هەست و هزری پەتی و بەرکەوتەی دامەزرێنەی ئەم قۆدیە پڕ و بەتالە لە شوێن و کات و ڕووداوەکان دەخولێتەوە....
**كات** : بۆیە دایکم هەموو جار دەیگوت ژیان وەك قالبە چوارگۆشەیەکی چووکلێت وایە کە ژیان تێدا بەردەوامە..**!**